کورتە چیرۆک

# شارلك هۆلمز

وەرگێڕانی لەئینگلیزییەوە

سارا علاءالدین رضا



چاپی یەکەم 2006

ناوی کتێب: شارێک هونەر
ناوی وەرگێڕ: سارا علاء الدین رضا
دیزاینی ناوەوە: دەریا محمد
دیزاینی بەرگ: هونەر وەهبی
چاپ: چاپخانەی رامان

ژمارەی سپاردنی (١٩٩) ی ساڵی ٢٠٠٦ پێ سپێردراوە

# شریتێکی خاڵاوی

# چیرۆکەکەی هێلین

لەکاتی ڕودانی ئەم چیرۆکەدا. مابومەوەلای شارلك هۆلمزی هاوڕێم بژیم. لەشوقەکەیدا لە شەقامی باکەری لەندەن. بەیانی یەکی زۆر زۆر زوو. ژنێکی گەنج. جلێکی ڕەشی پۆشی بوو. هات بۆ بینینمان، زۆرماندوو خەمبار دیاربوو. دەموچاوی سپی هەڵگەڕابوو، دەستی بەگریان کردوو ووتی: من ئەترسم.. لەمردن ئەترسم. مستەرهۆلمز تکایە یارمەتیم بدە. من کە تەمەنم سی ساڵ نابێت سەیری قژە ڕەصاصی یەکەم بکە. زۆرئەترسم.

هۆلمز بەسۆزێکەوە ووتی: بەس دانیشەوچیرۆکی خۆتمان بۆباس بکە "دەستی بەقسەکرد:

من ناوم هێلین ستۆنەرە" لەگەڵ باوە پیارەکەمدا ئەژیم، کە دکتۆر گریمسبی رۆیلۆتە. لەدێیەکی نزیك شارین، خێزانەکەی یەکەمجار زۆر دەوڵەمەندبوون. بەڵام کاتێك باوە پیارەکەم لەدایك بوو، پارەیان نەماوەو هەژارکەوتون. ئەویش ئەیخوێند بۆئەوەی ببێتە دکتۆر. بۆیە چوودەدەرەوە بۆ هند. لەوێش دایکمی بینی و خواستی. کاتێك کەمن و جولیای خوشکم زۆر منداڵ بووین. باوکمان مردبوو. سەیرکە. شارلك هۆلمز پرسی: لەوانەیە دایکت پارەیەکی زۆری هەبوبێت؟.

ئاخ.بەڵێ. دایکم پاردیەکی زۆری هەبوو. لەوکاتەوە باوە پیارەکەم زۆربەفەقیری نەمایەوە. هۆلمزووتی: خاتوو ستۆنەر شتی زیاترم

دەربارەی باوە پیارەکەت پێ بڵێ بەدڵنیاییەوە. ئەو پیاوێکی زۆر ئازار ترسناک بوو لەهەند یەکەم کەس بوو کەزۆر تووڕە بوو لە خزمەتکارە هەند یەکەیی و کوشتی بۆیەبەدیل گیرا دوای ئەوە هەموومان گەڕاینەوە بۆ ئینگلتەرا. دایکیشم هەشت ساڵ لەمەو پێش مرد پاشان باوە پیارەکەم هەمووپارەکەی دایکمی برد، بەڵام ئەگەر من وجولیا شوومان بکردایە. دەبوایە هەمووساڵێک ۲٥٠ پاوەندی پێ بدایناید هۆڵمزووتی: ئێستا ئێوە لە دێکەدا لەگەڵیدا دەژین بەڵێ مستەر هۆڵمز وەڵامی هێلین ستونەری دایەوە بەڵام ئەو لەماڵەوەدا دەمێنێتەوەو هەرگیز کەس نابینێت: ئێستا ئەو زۆر زۆر تووڕەو ترسناکە. هەندێ جار لەگەڵ خەڵکی دانیشتوی دێکەدا ئەجەنگێت ئێستا هەموو کەسێك لێی ئەترسێ وهەرکە ئەیبینن ڕائەکەن. هەروەها خەڵکی لە ئاژەڵە ووشکانی یە دڕندە هەندی یەکانی ئەترسان کاتێك بەئازادی بەدەوری باخەکانا ئەسوڕانەوە هاوڕێکانی لەهندەوە بۆیان ناردبوو. ئاژەڵەکان تەنها دڕندەو ئاژەڵی ووشکانی نەبوون لەناوباخەکەدا. بەڵکوو مرۆڤی کێوی و گەڕوکیشی لێ بوو. باوە پیارەکەم حەزی لەو خەڵکە دڕندانە بوو چونکە ئەیانتوانی بەوویست وخواستی ئەو بێن وبچن من وجولیای هەژار ژیانێکی زۆر ناخۆشمان هە بوو هیچ خزمەتکارێکمان نەبوو. هەمیشە بەجێیان ئەهێشتین چونکە لە باوە پیارەکەم زۆر ئەترسان. بۆیە دەبوایە ئێمە هەموو ئیشێکی ماڵەکەمان بکردایە. جولیا تەنها سی ساڵ تەمەنی بوو کەمرد. بەڵام قژی بەتەواوەتی ڕەصاصی بوو بووەوەکوئێستای من. شارلك هۆڵمز پرسی: کەی مرد؟ دوو ساڵ لەمەو پێش مرد هەر لەبەر

...يه من لێرەم ئێمە هەرگیز كەسمان نەدەبینی لەدنیەكەدا. بە
هەندێ جار سەردانی چەند خزمێكمان دەكرد كەلەنزیكی لەندەن
دەژیان. لەوێ جولیا پیاوێكی گەنجی بینی و داوای لەجولیاكرد
كەبیخوازێت. باوە پیارەكەم ڕازی بوو بەلام ماودیەكی كەم دوای ئەوە
جولیا مرد. خاتوو ستۆنەر دەستی خستە سەرچاوی و بۆماوەی
چەند دەقەیەك گریا. شارلك هۆلمز چاوی داخستبووكە گوێی بۆ
قسەكانی گرتبوو. بەلام دوایی چاوەكانی كردەوەو سەیری هێلین
ستۆنەری كردو پێی ووت: هەموو شتێكم دەربارەی مردنەكەی جولیا
پێ بلێ هێلین وەلامی دایەوە: من ئەتوانم هەموو ئەوشتانە بەباشی
بێنمەوە یادی خۆم. كاتێكی زۆر ناخۆش بوو. هەرسێ ژووری
نوستنەكانمان لەقاتی خوارەوە بوو. یەكەم ژوریان ژووری باوە
پیارەكەم بوو، ژوورەكەی جولیاش لەتەنیشتی ئەوەوە بوو. ژوورەكەی
تەنیشت جولیاش ژووری من بوو. هەموو ژورەكانیش پەنجەرەیان
لەسەرباخەكە بوو لەناو خانووەكەدا. دەرگاكانیشیان كراوە بوون بۆ
هەوا گۆڕكێ. ئێوارەیەكیان باوە پیارەكەمان جگەرە هندی یە
گەورەكەیی ئەكێشا لە ژوورەكەی خۆی. جولیاش نەیئەتوانی لە
ژوورەكەی خۆیدا بخەوێت چونكە بۆنی دوكەلەكە ئەچوو بەسەریدا.
بۆیە هات بۆژوورەكەی من بۆ ئەوەی قسەم لەگەڵ بكات. پێش ئەوەی
بگەڕێتەوە بۆ ناو جێگاكەی. پێی ووتم: هێلین تۆ لە نیوە شەودا
گوێت لەفیكە دەبێت؟ منیش بە سەرسامی یەوە ووتم: نەخێر "ئەمە
شتێكی غەریبە" ووتی: هەندێك كات گوێم لەفیكە دەبێت. بەلام نازانم
لەكوێوە یەت. بۆچی تۆ گوێت لێنابێت؟ پێكەنیم و ووتم: من

لەتۆباشتر ئەنووم. جولیا ڕۆشت بۆ ژوورەکەی خوی منیش دەرگاکەم لەدوایەوە داخست. شارلك هۆلمز پرسی: تۆبۆچی دەرگاکەت دائەخست؟ ووتی: ئێمە لەئاژەڵە دڕندەکان و مرۆڤە کێوی یەکان نەترساین. هۆلمز ووتی: تکایە بەردەوام بە ئەو شەوە نەمتواند بنووم. شەوێکی زۆر زریاناوی بوو. باران ولێزەمەیەکی زۆر بوو لەپڕێکدا گوێم لەقیژەی ژنێك بوو، کەدەنگی خوشکەکەم بوو. لە مەمەڕەکەدا ڕام کرد. هەرلەوکاتەشدا گوێم لەفیکە بووچەندچرکەیەك دوای ئەوەش جیرەی سنوقێکی ئاسن. نەمئەزانی ئەوە چی یە. ڕامکرد بۆ دەرگای ژووری خوشکەکەم. دەرگاکەی بۆکردمەوەو کەوتەسەر زەوی. دەموچاوی زەرد هەڵگەڕابوو ئەترساو ئەگریا. هیلین یارمەتیم بدە. یارمەتیم بدە. من نە خۆشم من ئە مرم "منیش باوەشم پیادا کرد. بەدەنگێکی بەرز ئەگریا هیلین. ئاخ خوایە گیان. هیلین شریتێك لێرەیە شریتێکی خالأوی! ئەو وویستی زیاتر بلێت. بەلام نەی توانی منیش بانگی باوە پیارەکەمم کرد، کێ هەوڵی دا یارمەتی بدات بەلام ئێمە نەمانتوانی هیچ بکەین. پاشان ئازیزم: خوشکە ئازیزەکەم مرد. هۆلمز پرسی: ئایاتۆ دلنیابویت لەئەو فیکەو دەنگی ئەوسندوقەئاسنە؟ هیلین ووتی: منیش وای بۆچووم بەلام زۆر زریانو باران بوو ئەو شەوە. لەوانەیە بەهەڵەدا چووبم. پۆلیس نەیان توانی لەوە تێبگەن خوشکەکەم بۆچی مرد. دەرگاکەی داخرابوو کەسیش نەی ئەتوانی بچێتە ژوورە کەیەوە. هیچ نەخوشیەکیان لەلاشەیدا نەدۆزیەوە. ودنەیانتوانی بزانن کە ئەو شریتە خالأوی یە چی بوو؟ پیاوە کێویەکان لەوانەبوون کەهەندێك شتیان ئالأندبووە ملیانەوە. من

وای بۆئەچم کەئەولەترسا مردبێت، چونکە زۆر ئەترسا بەلاّم نازانم ئەو لەچی ئەترسا! لەوانە یە لەئەو کێویانە ترسابێت. ئەی تۆ چۆنی بۆ ئەچیت، مستەر هۆلمز؟

هۆلمز بۆماوەی دەقیقەیەك بیری کردەوە. ئا !!!! ووتی: ئەمە پرسیارێکی قورسە. بەلاّم تکایە بەردەوام بە. هێلین ستۆنەر ووتی: ئەمە دووساڵ لەمەوپێش بوو. بەبێ خوشکەکەم زۆر هەست بە تەنیایی ئەکەم. مانگێك لەمەو پێش هاورێیەکی ئازیزی خۆم داوای لێکردم شوی پێ بکەم. باوە پیارە کەم رازی بوو ئێمەش وویستمان زۆر بەزوویی بەیەك بگەین بەلاّم دووڕۆژ لەمەو پێش وویستم بچم بۆ ژووری نوستنە کۆنەکەی خوشکەکەم، چۆنکە چەند پیاوێك خەریکی چاك کردنەوەی دیواری ژووری نوستنەکەی خۆم بوون، شەوی ڕابردوو جارێکی تر گوێم لە فیکەکە بوەوە بۆیە رام کردە دەرەوەی ماڵەکەو ڕاستەو خۆ هاتم بۆ لەندەن بۆئەوەی بەدوای یارمەتی تۆدابگەڕێم داوای یارمەتیت لێبکەم تکایەمستەر هۆلمز یارمەتیم بدە.. نامەوێ وەکو جولیا بمرم.

مستە ر هۆلمز ووتی: ئێمە پێویستە بەخێرایی بجولێین. ئەگەر ئێمە ئەمرۆ بچین بۆ ماڵەکەی تۆئەتوانین ئەو ژورانە ببینین؟ بەلاّم پێویستە باوە پیارەکەت هیچ نەزانێت!.

ئەو ئەمرۆ لەلەندەنە، وە ئەویش ئەیەوێ تۆ ببینێت، ئۆه .. زۆر سوپاس مستەر هۆلمز، واهەستەکەم ئێستا باشترم.

# هۆڵمزو واتسۆن

# سەردانی خانووەکە دەکەن

هۆڵمز بەیانی یەکەی هاتەدەرەوە بەڵام کاتی نانخواردنی نیوەڕۆ گەڕایەوەبۆماڵەوە. پاشان بەیەکەوە بە شەمەن نەفەر چوین بۆدی یەکەو تاکسی یەکمان گرت بۆ ماڵی دکتۆر ڕۆیلۆت. هۆڵمز پێی ووتم: سەیرکە، هاوڕێ ترسناکەکەمان. ڕۆیلۆت: پێویستی بەپارەی کچێکە چونکە ئەو ساڵانە تەنها ٧٥٠ پاوەنی دەدرێتێ لەژنە مردووە کەیەوە. ئەم بەیانیە کەچومە دەرەوە ئەمەم دۆزی یەوەلەمەتێگەیشتم بەڵام وەحشی یەکان. فیکەکان، باندەکان، ئەمانە زۆر قورسن تێگەیشتن لێیان. بەڵام وابزانم وەڵامم دەبێت بۆیان. کاتێك ئەسوڕاینەوە. هێلین ستۆنەر سێ ژووره نوستنەکەی نیشان داین. ئێمەش یەکەمجار سەیری ژوورەکەی خۆیمان کرد. هۆڵمز پرسی: بۆچی دیواری ژووری نوستنەکەی تۆیان چاك کردۆتەوە؟ خۆ هیچ کەموکوڕی یەکی تێدا نییە.؟ هێلین ووتی: تۆڕاست ئەکەیت. واهەست ئەکەم ئەمە پلانێك بێت بۆ ئەوەی بمگوێزنەوە بۆ ژووری نوستنی خوشکەکەم. هۆڵمز ووتی: بەڵێ. چووین بۆ ژوورەکەی جولیا. هۆڵمز بەحەزەرەوە سەیری پەنجەرەی ژوورەکەی کردو ووتی: کەس ناتوانێت لەدەرەوە بێتە ناوەوە، پاشان سەیری چواردەوری ژوورەکەی کرد. بۆچی ئەم جەرەس و حەبلە لێرەدایە؟ تەنها لەژێر سیسەمی نوستنەکەدا؟ باوە پیارەکەم لەدووساڵ لەمەو پێشەوە ئەمەی لێرەدا داناوە. ئەمە بۆ بانگکردنی خزمەتکارەکانە. بەڵام من و جولیا هەرگیز ئەمەمان بەکار

نەهێناوە چونکە ئێمە هیچ خزمەتکارێکمان نەبوو. ئەو لەشوێنی هەوا گۆڕەکەشدا دایئابوو. لەنێوان ژوورەکەی خۆیی و ژوورەکەی جولیادا. هۆلمز حەبلەکەی ڕاکێشا بەلاّم بەکارنەهێرابوو. ووتی: چەند سەیرە "پاشان تەنها لەناو هەواگۆڕەکەدایە. ئەمەش دیسان ئاڵۆزە" باشە بۆچی هەواگۆڕەکە تەنها لەناوەوەی دیوارەکەدایە؟ کە واباوە هەمیشە هەواگۆڕ لە دەرەوەی دیواردابێت. پاشان چووین بۆ ژوورەکەی دکتۆر ڕۆیلۆت. هۆلمز سندوقێکی گەورەی ئاسنی بینی لەنزیک دیوارەکەوە.

هێلین ووتی: باوە پیارەکەم وەرەقە ی ئیش وکارەکانی خۆی تێدا داناوە. هۆلمز ووتی: ئایائەو پشیلەشی تیا دائەنێت؟ سەیرکە هەندێك شیر لەقاپێکدا لەسەر سندوقەکەیە. هۆلمز ووتی: خاتوو ستۆنەر ئێستا هەست ئەکەم ژیانی تۆشەوان لەمەترسیدایە. من و واتسۆنی هاوڕێم پێویستە ئەمشەو لەژووری خوشکەکەتدا بەسەر بەرین. کاتێك تۆ چەند چرکەیەك بێت نوستبیت. من و خاتوو ستۆنەر زۆر بەسەرسامی یەوە سەیریمان دەکرد. بەڵێ ئێمە پێویستە. بەردەوام بوو لە قسەکردن، ئێمە ژوورێکی ئۆتێلێك دەگرین لەدێکەدا، کاتێك باوە پیارەکەت چوو بۆ نوستن. مۆمێك لە پەنجەرەی ژووری نوستنی خوشکەکەت دا داگیرسێنە و دەرگاکە بەکراوەیی بەجێ بهێڵە. پاشان بچۆ بۆ ژوورە کۆنەکەت و ئێمە ش بەناوپەنجەرەکەدا دێین بۆ ژووری نوستنی خوشکەکەت. چاوەڕێی فیکەکەودەنگی سندوقەئاسنەکە دەکەین. هێلین ووتی: مستەر هۆلمز خوشکەکەم چۆن مرد؟ تۆ دەزانیت؟ تکایە پێم بڵێ. هێلین قوڵی شارلك هۆلمزی

گرتبوو. شارلك هۆلمز هەر نەیوتەوە: من پێویستە زۆر زیاتر شت بدۆزمەوە پێش ئەوەی بەتۆ بڵێم خاتوو ستۆنەر. ئێستاش خوا حافیزو مەیش ترسە. ئێمە بەناو دێکەدا پیاسە دەکەین. هەروەها هۆلمز بەمنیشی ووت: بەدڵنیایی ئەمشەو شەوێکی ترسناك دەبێت. ڕۆیلۆت پیاوێکی زۆر ئازاو ترسناکە، منیش ووتم: بەڵام ئەگەر من بتوانم یارمەتیت بدەم . نەبێت هەر لەگەڵت بێم؟ سوپاس واتسۆن. بەدڵنیایی پێویستم بەیارمەتی تۆ دەبێت. تۆ ئەو جەرەس و حەبلە دەبینیت لەگەڵ هەواگۆڕەکە؟ پێش ئەوەی بێین من دەربارەی ئەو هەواگۆڕە شتم ئەزانی بەدڵنیایی. ئەوە ئەو کونەیەکە لەنێوان دوو ژووردایە. سەیر لەوەدایە چۆن خوشکەکەی هێلین بۆنی جگەرەکەی ڕۆیلۆتی کردووە.؟ بەگریانەوە ووتم: ئازیزم هۆلمز تۆچەندە زیرەکیت!! هۆلمز ووتی: ئەو سیسەمی نوستنە دەبینیت؟ کە چەقێنراودتە ناو زەوی یەکەوە.؟ جولیا نەیتوانیوە بیجوڵێنێت. بۆیە پێویست بووە لەژێر حەبلەکەدا بمێنێتەوە. هەر یەکەشیان لەنزیکی هەوا گۆڕەکەوەن. هۆلمز خەریکەتێئەگەم. ئەمە چ تاوانێکی گەورەو چەپەڵە. بەڵێ. ئەو دکتۆرە پیاوێکی زۆر زیرەك بووە، بەڵام واتسۆن من وا هەستەکەم ئێمە ئەتوانین بیوەستێنین.

# مردن لەشەودا

ئەر ەوە، کاتێك مۆمەکەی هێلین ستۆنەرمان بینی گەڕاینەوە بۆ ماڵەکە، لەگەڵ هۆلمز بە هێواشی بەناو پەنجەرەکەدا چوینە ژوورەوە، پاشان بەبێ دەنگی چاوەڕێمان کرد لە ژوورەکەی ناوەڕاست دا بەتاریکی، (٣) سەعات چاوەڕوان بووین وجوڵەمان نەکرد لەپڕێکدا ڕوناکی یەکمان بینی و گوێمان لە دەنگێك بوو لە ژوورەکەی دکتۆر ڕۆیلۆت، بەلاّم هیچ شتێك ڕووی نەدابوو. دیسانەوە لەتاریکیدا چاوەڕوان بووین. پاشان گوێمان لەچەند دەنگێکی جیاوازبوو. دەنگێکی زۆر هێواش، هۆلمز لەپڕێکدا خۆی هەڵدابۆ سەرەوەو حەبلی جەرەسەکەی زۆر بەخێرایی ڕاکێشا. هاواری کردو ووتی: واتسۆن تۆ دەتوانی ئەوە ببینیت؟ بەلاّم من هیچم نەبینی. فیکەیەکی هێواش دەنگی دەهات. ئێمە هەردووکمان سەیری سەرەوە مان کرد بۆ هەواگۆڕەکە، لەپڕێکدا گوێمان لەگریانێکی ترسناك بوو لەژوورەکەی تەنیشتمان. ماڵەکە دیسانەوە بێدەنگ بووەو، پرسیم ئەو پیاوە چی یەتی؟ دەنگم بچڕ بچڕ بوو، هۆلمز وەلاّمی دایەوە: ئەو کۆتایی پێهات. بابڕۆین وببینین، چووین بۆ ژورەکەی دکتۆر ڕۆیلۆت. سندوقە ئاسنەکەکرابووەو. ڕۆیلۆت لەسەر کورسی یەك دانیشتبوو. چاوەکانی دەرپەڕیبون بەرەو هەوا گۆڕەکە، ڕووخسارێکی زەرد هەڵگەڕاوو سەیری هەبوو، ئەو مردبوو. هۆلمز زۆر بە هێواشی ووتی: ئەو شریتە ئەو شریتەخالاّوی یە، شریتەکەجولاّوەو دەستیان کردووە بە سوڕانەوە ئەمە دەستە. زۆر بەحەزەر بە واتسۆن ئەوە مارە مار. ماری

هندی‌یەو ژەهراوی‌یە ئەتوانێت زۆر بەخێرایی بتکوژێت. هۆلمز گریا. ڕۆیلۆت دەست بەجێ مردووە. ئێمە دەبێت ئەو مارە لەپشت ئەم سندوقەوە دابنێین. زۆر زۆر بەحەزەرەوە. هۆلمز مارەکەی گرت و فڕێی دایە ناو سندوقە ئاسنەکەوە. ووتم: بەلام تۆچی دەزانیت دەربارەی ئەم مارە؟ هۆلمز واتسۆن یەکەمجار وامزانی کە ئەوە دڕندەکان بوون. بەلام لەپاشاندا تێگەیشتم، وام بەبیرداهات کە لەوانەیە چەند شتێك لەناو هەواگۆڕەکەوە هاتبێت و لەژێر جەرەس و حەبلەکەوە و کەوتبێتە سەر جێگای نوستنەکەی. پاشان شیرهەیە، کە بەدڵنیایی‌یەوە مار شیر دەخواتەوە، ئەمە ئاسان بوو بۆ دکتۆرێکی ئاژەڵی هندی، پاشان لەبەرئەوەی ئەو دکتۆر بوو ئەوەی ئەزانی کە ژەهری ئەو مارە زۆر سەختە دۆزینەوەی لەلاشەی مردویەکدا.

هەروەها ئەو هەموو شەوێ مارەکەی فڕێ ئەدایە ناو هەوا گۆڕەکەوە وئەویش بە تۆپ و حەبلەکەدا ئەهاتەخوارەوە بۆسەرجێگای نوستنەکە، بەدڵنیاییەوە هیچ کەسێك نەدەبوو مارەکە ببینێت، وە هەموو شەوێك فیکەی لێدەدا بۆئەوەی مارەکە بانگ بکات بگەڕێتەوە بۆ دواوە ئەو دەنگەی کەلەناوەڕاستی شەودا هەستی پێدەکرا ئەوەدەنگی دەرگای سندوقە ئاسنەکەبوو کە کردبووی بەماڵی مارەکە، لەوانەیە مارەکە جەند جارێك بەناو هەواگۆڕەکەدا هاتبێت پێش ئەوەی جولیا بکوژێت بەلام لەکۆتایدا جولیای کوشت، وەهیلین یش لەمردن نزیك بوەوە بەهۆی مارەکەوە. بەلام لەشەودا کاتێك من مارەکەم ڕاکێشا بەحەبلەکە تورەبوەو بەناو هەواگۆڕەکەدا گەڕاوەتەوە بۆدواوەو دکتۆریشی کوشتووە، من بە داخاوەنیم دەربارەی ئەمە .

ماوەیەکی کەم دوای ئەوە هیلین ستۆنەر شووی کرد بە کوڕە گەنجەکەو هەوڵی دا مردنی سەختی خوشکەکەیی و باوە پیارەکەی لە بیر بکات. بەڵام بەدڵنیاییەوە هەرگیز ئەو شریتەخاڵاوی یەی لەبیر ناچێتەوە.

## ووتی ووتی لە بۆ هیمیا
## هەڵەی پادشا

بۆشارلك هۆلمز تەنها یەك ژن هەبوو لەژیاندا. ئەو ژنەکەی خۆش نەئەویست. لەبەرئەوەی ئەو هەرگیز ژنی خۆش نەئەویست. بەڵام لەدوای بینینی یەوە ئەو هەرگیز ژنەکەی بیر نە ئەچووەوە کەناوی ئیرین ئادلەر بوو.

شەوێکیان لەمانگی مارچ دا سەردانی هاوڕێ کۆنەکەمم کرد بۆماڵەکەی خۆی لە شەقامی باکەر

لەوکاتەدا من ژنم هێنابوو وە هێشتا ئەوم نە بینیبوو. ئەو پێی ووتم: وەرە واتسۆن دانیشە خۆشحاڵم بەبینینت چونکە هەندێك شت ئەهێنم نیشانی تۆی ئەدەم بزانم بۆچوونت چی ئەبێ دەربارەیان" ئەمە لە پۆستی پێشوودا گەیشتووە. ووتی: ئەمە نامەیەکە. کە نە رۆژ نە ناو نە عینوانی لەسەر نەنوسراوە. ووتم: لە شەودا یەکێك سەردانی تۆی کردووە بۆ گفتو گۆکردن دەربارەی کارێکی زۆر نهێنی. تۆ پێویستە یارمەتی کەسانی مەزنی تر بدەیت. تۆ ئەتوانیت و ئێمەش هیوا خوازین. یارمەتی ئێمە بدە بەوەی لەژوورەکەی خۆت بیت کاتژمێر

(٧:٤٥)ی ئێوارە، هۆڵمز پرسیاری کرد وەرەقەکان. تۆچۆن دەربارەی ئەم وەرەقانە بیر دەکەیتەوە؟ من هەوڵدەدەم وەکو هۆڵمز بیر بکەمەوە. ئەو وەرەقانە زۆر گرانبەهان، بۆیە ئەم کەسە دەوڵەمەندە، ئەوانەچەند وەرەقەیەکی غەریبن، بەڵێ: ئەو کاغەزانە ئینگلیزی نین ئەگەر سەیریان بکەیت لەبەر ڕوناکی ئەبینیت ئەوانە لە بوهیمیاو ئەڵمانیا دروست کراون، من واهەستەکەم نامەکان نوسراون. ئۆو ئەوە پیاوەکەمان گەیشت ئەتوانین گوێبیستی ئەسپەکان بین لەشەقامەکەدا، پرسیم: من ئەبێت بڕۆم؟ هاوڕێکەم وەڵامی دایەوە نەخێر. نەخێر. من پێویستم بەیارمەتیت دەبێت.: بەدڵنیایی ئەوە ئاسان دەبێت. لەدەرگا درا، هۆڵمز بانگی کرد وەرە ژورەوە. پیاوێکی بالاّ بەرزی بەخۆوەبووهاتە ژورەوە، جلێکی گرانبەهای لەبەردابوو، ڤیناعێکی دابوو بەسەردەموچاویداو ووتی: تۆدەتوانیت بە کۆنت ڤان کرام بانگم بکەیت، من لە بۆهیمیاوە هاتووم. کارەکەم زۆر گرنگە، پێش ئەوەی دەربارەی کارەکەم قسەت بۆ بکەم، خۆپێت ناخۆش نابێت جگەرەیەك دابگیرسێنم؟ پێکەوە ووتمان: ئێمەش دائەگیرسێنین.

مرۆڤە خاوەن پلەوپایەکە، کەخۆی لەشانی خێزانە پادشاو گەورەکان دەدا. ڕێگەم پێ دەدەیت دەربارەی کارەکەم بدوێم؟ دەستی پێکرد. من ڤیناعم لەسەرکردووە بۆئەوەی کەس نەتوانێت بزانێت چ مرۆڤێکم، پێویستە ڕوونی بکەمەوە کە ئەم کارە چەندگرنگە. ئەگەر تۆ توانای یارمەتیت نەبێت، ئەوە زۆر قورس و گران ئەبێت بۆ یەکێك لە خێزانە بەناوبانگ و گرنگەکانی ئەورووپا و بێگومان عەیب وعارێکی

گەورە یە. من قسە دەربارەی خانوە بەناوبانگەکەی ئۆرمستین. پاشای بۆهیما. دەکەم، هۆلمز ووتی: من دەزانم گەورەم، ئەو بەهێواشی مژی لەجگەرەکەی دەدا. پیاوەکە لەسەرکورسیەکەیەوە بەرزبووەوەو هاواری کرد: چیی!! تۆ چۆن دەزانیت من کێم؟! پاشان قیناعەی لەسەر دەموچاوی بەرزکردەوەو فڕێی دایە سەر زەوی، تۆ ڕاست دەکەیت، من چۆن ئەتوانم ئەوە بشارمەوە کە من پادشاکەم. ویلهێلم ڤان ئۆرمستێنم، پادشای بۆهیمیا. من هاتووم تۆببینم چونکە ناتوانم چیرۆکی خۆم لای هیچ کەسێکی ترباس بکەم. ئەمەش ئەبێت نهێنی بێت. تێگەیشتیت؟ هۆلمز ووتی: زۆر بەباشی تێگەیشتم بەردەوام بە، عەینەکەکەیی لەچاوکردوو گوێی بۆگرت. پێنج ساڵ لەمەوپێش. گەیشتم بەژنێك بە ئیرین ئادلەر بانگیان دەکرد، ئێمە......، هۆلمز ووتی: ئاە ئیرین ئادلەری گۆرانی بێژ لە سالی (١٨٥٠) لەدایك بوو، لە لەندەن ئەژیا، ژنێکی زۆرجوان بوو، من بیستومە... سەیرێکی پاشاکەی کرد، تۆلەگەڵ ئەو... تۆ ماوەیەك ئەوت خۆش ویستبوو؟ پاشان وازت لێهێنا؟ بەلآم پێش ئەوەی وازی لێ بهێنیت، لەوانەیە تۆ چەند نامەیەکت بۆ نوسیبێت؟ ئێستاش ئەتەوێ ئەونامانە بگەڕێنیتەوە؟

- ئەمەڕاستە..

-ئایاتۆخوازبێنیت کرد؟

-نەخێر.

ئەی ئەوداوای پارەی لێکردیت بەرانبەر بەوەی نامەکانت پیشان بدات ؟ تۆنەتوانیت ئەوە بڵێیت کە ئەونامانە تۆ نەتنوسیون؟

- بەلاّم مستەر هۆلمز ئەو وێنەی منیشی لەلایە.
- تۆئەتوانیت ئەوە بڵێیت کەتۆ ئەو وێنانەت نەداوەتی؟.
- ئێمەهەردووکمان لەوێنەکەداین.
- ئۆه بەڕێزم، ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە، بۆ جەنابتان.
- من دەزانم بێعەقڵ بووم.. بەلاّم ئەوکاتە زۆر گەنج بووم.!
- تۆ دەبێت ئەو وێنانە بگێڕیتەوە، دەتوانیت لەماڵەکەیدا بیدزیت؟
- پێنج جارهەولّم داوە بەلاّم پیاوەکانم ناتوانن بیدۆزنەوە، من چیم لەدەست یەت بیکەم؟
- هۆلّمزپێکەنی. ئەوە زۆرئاسانە. ئەبێت ئەو چۆن پلانێکی بۆ ئەو وێنانە دانابێت؟
- لەماوەیەکی نزیکدا دەچم کلۆتیڵد لۆپمان ڤان سەیخە دەخوازم کە کچی پادشای سکاندیناڤایە، بەدڵنیاییەوە تۆدەزانیت کە ئێمە هەردوکمان دووخێزانی گەورەو گرنگین لە خێزانە پادشاکانی ئەوروپا. بەدڵنیایی کلۆتیڵد هەرگیز ڕازی نابێت ببێت بە هاوسەرم ئەگەربزانێت کەمن ئەوەم هەبووە... هاوڕێی ئیرین ئادێلّ، دڵنیام تۆنازانیت ئیرین ئادێلّ کێیە. ئەوژنێکی زۆر جوان و قەشەنگ بوو بەلاّم ئەیتوانی وەکو پیاو بەهێز بێت، زۆرتوڕە بوو کاتێك وازم لێهێنا نەیدەویست من هیچ ژنێکی تربخوازم، ئەوە دەزانم و دڵنیام لەوەی کە وێنەکان دەنێرێت بۆ خێزانی سەیخ، ئەوکاتەش ئەوە دەبێتە فەزیحەو

ـەیب وعارێکی سەخت، پێویستە ئێمەلائەو وێنانە بدۆزینەوە پێش ئەوەی ئەو بۆیان بنێرێت.!

- هۆڵمز ووتی: من دڵنیام لەوەی کەدەیاندۆزینەوە. دڵنیام تۆ لە لەندەن دەمێنیتەوە؟ بەدڵنیایی بۆت دەنوسم و پێت دەڵێم چی روویداوە، لەگەڵ پارەکە...؟

- پادشاکە جانتایەکی دەستی زۆر گەورەی لەسەرمێزەکەدانا و ووتی: من پێویستە ئەو وێنانەم دەست کەوێ، ئەوە یەك هەزار پاوەندە لێرەدا، ئەگەرپارەی زیاترت پێویست بوو،ئەوە دوو دڵ مەبە لەداواکردنی، پارەگرنگ نییە. هۆڵمز ووتی: لەگەڵ ناونیشانی ژنە گەنجەکە.

- برۆنی لۆدج،سێپێنتاین ئەڤینیۆ، شەقامی جۆنس وود، لەندەن.

- هۆڵمز ووتی: شەوت شادگەورەم، هیوادارم لەماوەیەکی نزیکدا هەندێك هەواڵی باشت پێبگەیەنم. پادشا رۆشت، هۆڵمزیش ئاوڕی بۆمن دایەوە، شەو ێکی شاد.. واتسۆن. تکایە سبەینێ کاتژمێر (٣)ی پاش نیوەڕۆ بگەڕێوە بۆلام.

# خزمەتکارێك

# لەدەرەوە دەدۆزرێتەوە

ڕۆژی داهاتوو کاتێك گەڕامەوە، هۆڵمز لەماڵەوە نەبوومنیش لە ژوورەکەیدا چاوەڕێم دەکرد، لە سەعات (٤)ی تەواودا دەرگاکەکرایەوە، خزمەتکارێکی زۆر سەیروغەریب هاتەژورەوە، جلێکی پاکی کۆنی لەبەردابوو، زۆربەسەرسامی یەوە سەیرم دەکرد پێش ئەوەی بزانم کە ئەمە هاوڕێ کۆنەکەمە.

هاوارمکرد: هۆڵمزتۆئەبێ لەکوێ بیت؟

بە پێکەنینەوە بەدوامدا ووتی‌یەوە، من لە ڕۆژێکی زۆرباشدام. لەدەرەوەی ماڵەکەی خاتوو ئارین ئەدلێرس بووم، خزمەتکارەکان هەمیشە دڵخۆشبوون بەقسەکان، لەگەڵ ئەوەشا گوێم لە چەند قسەیەك بوو دەربارەی ژنە گەنجەکە، بۆ نمونە، هاوڕێیەکی پیاوی زۆر باشی هەیە ناوی گۆدفری نۆرتەنە، ئەو پارێزەرەی هەمیشە سەردانی دەکرد، ئێستاچی؟ ئەگەر ئەو پارێزەری ئەوبێت، لەوانەیە هەموو وێنەکانی بەئامادەکراوی پێ دابێت، بەڵام ئایا پارێزەرەکە ئارینی خۆش ویستووە؟ ئارین وویستی وێنەکانی نیشان بدات؟

ووتم: هۆڵمزشتێکی زۆر سەیرە! هەرلەوساتەدامن لەوێ بووم، مستەر نۆرتەن خۆی لەپڕێکدا شوێنەکەی بەجێهێشت. من لە پەنجەرەکەوە سەیرم ئەکردن، کاتێك ئەو ڕۆشت، خۆی فڕێدایە تاکسی یەکەوە، بەرەو کەنیسەیەك چوو لە شەقامی مۆنیکا، کەبەهەمووتوانی کەبتوانێت،! هاواری کرد. دوو دەقە دواتر خاتوو ئەدلێری کردە دەرەوە لەماڵەکەی‌خۆی، خۆی فڕێدایە تاکسی یەکی ترەوە وهاواری کرد، بڕۆبۆکەنیسە لە لە شەقامی مۆنیکا، بەخێرایی!!

واتسۆن نەمتوانی لەوە تێبگەم. منیش خۆم فرێدایە ناوسینیەم تاکسی و، کاتێك من بەرێکەوتم ئەرۆشتم بەرەو کەنیسەکە. گۆدفری نۆرتەن، سەیری دواوەی کردوو منی بینی

هاواریکرد: سوپاس بۆخوا.خێراوەرە بۆئێرە.!

من پرسیم بۆچی؟ وەرە پیاوەکە ئێمە پێویستیمان پێتە. پاشان یارمەتی گۆدفری نۆرتەنم دا بۆئەوەی ئارین ئەدلێر بخوازێت. ئەوان پێویستیان بەشایەت هەبوو. لەگەڵ خزمەتکارێکی سەرشەقامەکە باشترەلەوەی کەکەسی لێنەبێت.

پاشان شووی پێکرد.! پرسیم: ئێمە ئێستاچی بکەین؟

ئازیزم واتسۆن دڵنیابە لەشەودا، پێویستم بەیارمەتیت دەبێت. تۆئەزانیت من داوای چی ئەکەم؟ بەبێ پرسیارکردن.؟ بڵێ بەخۆشحاڵی یەوە هۆلمز، وەلامم دایەوە: ئەگەر وابزانیت ئەمە گرنگترە.

دوای ئەوە،

چووین بۆ بیرۆنی لۆدج، ئارین ئەدلێر، یان ئارین نۆرتەن. لەسەعات (٧)تەواودا ماڵەوە بەجێدەهێڵێت. دڵنیاشم داوام لێدەکات بچمەناو ماڵەکەیەوە، تۆ دەبێت لەدەرەوە چاودێروان بیت لەنزیك پەنجەرەی ژووری دانیشتنەکەوە. کە کرایەوە. سەیری من بکە لە ناوەوە. کاتێك دەستم بەرزدەکەمەوە: ئەم شتە فرێبدە ناو ژوورەکەوەو هاواربکە. ئاگر..!! شتێکی بچوك لە دەرەوە ئەدەمە دەستت. ووتم هۆلمز ئەو شتە چییە؟ ئەو شتە پاکەتێك جگەرەیە. ژوورەکە زۆر بە خێرایی پڕدەبێت لەدووکەڵ. دوای ئەوە، لەسەر سوچی کۆلانەکە چاوەڕێم بکە.

ووتم: دڵنیابە ئەوە دەکەم کە تۆ دەتەوێ.

# ئاگر

ئەو ئێوارەش هۆڵمز کڵاوێکی ڕەش و جلی گەورەو جیاوازی لەبەرکرد، ئەو تەنهاجلەکانی جیاواز نەبوون، دەموچاوی و قژی و هەمووشتێکی خۆی گۆڕیبوو، پیاوێکی جیاوازبووبەناو سێرپێنتاین ئەڤینوٚ دابەیەکەوە پیاسەمان دەکرد، خەڵکێکی زۆریش لەناو ماڵەکەدابوون. کۆمەڵێکیش لەدەوری دوکەڵەکەپێئەکەنین وقسەیان دەکرد من و هۆڵمزیش هاتوو چۆمان دەکرد لە بەردەم ماڵەکەدا.

هۆڵمز پێی ووتم: "تۆدەبینیت" وای بۆ دەچم کە ئەو نەیویستبێ مێردە تازەکەی دەربارەی وێنەکان هیچ بزانێت، بەلاّم ئایا وێنەکان لەکوێن؟ ئایا لەبانك دایناوە؟ نەخێر ژنان حەز ئەکەن شتە گرنگەکانیان لەلای خۆیان بهێڵنەوە. من دڵنیام کە وێنەکان لە ماڵەکەیدان.

ووتم: بەلاّم پیاوەکانی پادشا زۆر هەوڵی دۆزینەوەیان داوە.

هۆڵمز ووتی: بەڵێ بەلاّم ئەوان نەیانزانیوە سەیری کوێ بکەن.

ووتم: بەلاّم تۆچۆن دەزانیت؟

من وویستم ببیبینم، خۆی پیشانی دام، هەرلەوکاتەدا تاکسیەکە گەیشت، پیاوێك لەپیاوەکانی سەرشەقامەکە ڕایکرد بۆ ئەوەی دەرگاکە بکاتەوە، بەلاّم پیاوەکانی تر وەستاندیان و نەیانهێشت. پیاوەکانی تر هەموویان وەستان و هاواریان ئەکرد، شەڕو هەرا دەستی پێکرد، ئارین نۆرتەن لەناوەڕاستی ئەمەدابوو. بەلاّم شارلك هۆڵمز ڕایکرد بۆئەوەی یارمەتی بدات. پاشان لەپڕێکدا کەوت

بەزەویدا. خوێنیش بەدەموچاوی هۆڵمزدا ئەهاتەخوارەوە. ئارین نۆرتەن، پەلەی کردبۆدەرگاکەی تەنیشتی، بەلام سەیرێکی دواوەی کرد، هاواریکرد: کێیەك لەئەوان یارمەتی منی دا! ئەوپیاوە هەژارەبریندار بووە؟

چەند دەنگێك هاواری کرد: مردووە!

ئەوانی تر هاواریانکرد: نەخێرتەنهابریندابووە.

ئارین ووتی: بیبەنە ژووری دانیشتن، چەندکەسێك هۆڵمزیان گواستەوە بۆناو ماڵەکە، لەدەرەوەی پەنجەرەکە سەیرم ئەکردو چاوەڕوان بووم. بینیم ئارین نۆرتەن چۆن جوانێکە! پاشان هۆڵمز دەستی بەرز کردەوە، منیش دارە دوکولاوی یەکەم فڕێدایە ناوژوورەکەوە، ڕاستەوخۆ خەڵکی سەرشەقام وناوماڵەکە دەستیانکرد بەقیژاندن و بەدەنگێکی زۆربەرز ئەیان ووت (ئاگر) ماڵەکە پڕ بوو لە دوکەڵ. بە ڕێگەدا ئەڕۆشتم، (١٠) دەقیقە دوای ئەوە هۆڵمز هات بۆ بینینم، ووتی: واتسۆن دەسکەوتێکی باش بوو.

پرسیم: ئەبێت وێنەکانت هێنابێ؟

وەلامی دامەوە: من ئەزانم لەکوێدایە خۆی پیشانی داوم. بەلام بۆچی پیشانی تۆی داوە؟ پێکەنی و ووتی: ئەوە ئاسانە تۆئەو هەموو خەڵکەت لەسەر شەقامەکە بینی، داوام لێکردبوون یارمەتیمان بدەن، ئەوە شەڕو هەرا نەبوو، خوێنەکەش ڕاستی نەبوو. کاتێك خەڵکەکەهاواریکرد" ئاگر" ژنەکە ڕایکرد بۆ شتە زۆر گرنگەکانی خۆی لەماڵەکەدا، مناڵەکەی، ئاڵتونەکانی، یان... وێنەکان. خاتوو نۆرتەن ڕایکرد بۆدۆزینەوەی وێنەکانی، کە لەناو سندوقی جلەکانیدا

بوو لەژووری دانیشتنەکە، من ئەمەم بینی، بەلام نەمبردن، دلنیابووم بۆ سبەینێ لەگەڵ پادشادا دەگەڕێینەوە بۆماڵەکە، بەلام زۆر زوو پێش ئەوەی ئەو لەخەو هەڵسێت. پادشا بەدەستی خۆی دەتوانێت وێنەکان لەسندوقەکە دەربهێنێت. پاشان دەڕۆین. کاتێك هۆڵمزقسەی دەکرد، دەگەڕاینەوە بۆماڵەوە لە شەقامی باکەر، کاتێك گەیشتینە ماڵی هاوڕێکەم، پیاوێکی گەنج بەخێرایی دوامانکەوتبوو، ووتی: مستەر شارلك هۆڵمز شەوێکی شاد. هۆڵمز پێی ووتم پێشتر گوێم لەو دەنگەبووە، سەیرێکی خوارەوەی شەقامەکەی کرد، بەلام ئەوە کێ بوو؟!!!

# وێـــنـــەکـــان

بۆ ڕۆژی دوایی لەگەڵ پادشادا چووین بۆ ماڵەکەی ئارین نۆرتەن، خزمەتکارە کۆنەکە دەرگاکەی لێکردینەوە، پێکەنی و ووتی: مستەر شارلك هۆڵمز؟! هاوڕێکەم ووتی: بەڵێ، زۆر بەسەرسامی‌یەوە سەیری دەکرد. خاتوو ئارین نۆرتەن و هاوسەرەکەی ئەم بەیانی یە ئینگلتەرایان بەجێهێشت و هەرگیزناگەڕێنەوە بۆئەم وولاتە. هۆڵمز هاواریکرد: چی؟؟! دەموچاوی زەرد هەڵگەڕاو توڕەبوو، پادشا هاواریکرد: ئەی وێنەکان؟ هەمومان ڕامانکرد بۆ ژووری دانیشتنەکە، هۆڵمز ڕایکرد بۆ سندوقەکەو کردییەوە، وێنەی لەناودابوو، بەلام وێنەی ئارین ئادلەرو پادشا نەبوون، بەڵکو وێنەی ئارین ی شۆخ و شەنگ بوو بەتەنها. تەنها نامەیەك بوو بۆ شارلك هۆڵمزو هەموومان بەیەکەوە خوێندمانەوە.

ئازیزم مستەر شارلك هۆڵمز. تۆ زۆر بە باشی ئەوە ئەزانیت من وامزانی کە ئەوە ئاگرێکی ڕاستییەو تۆش تەنها یەکێکیت لە پیاوە دێرینەکان. بەلاّم دوای ئەوەی سندوقەکەم کردەوە دەستمکرد بەبیرکردنەوە، دەربارەی شارلك هۆڵمزی بەناوبانگ شتم دەزانی ناونیشانی تۆم ئەزانی، ئەوەشم دەزانی کە ئەو پادشایە داوای لێکردویت ئەو وێنانەی بۆبدۆزیتەوە. زۆر بەخێرایی جلی پیاوێکی گەنجم لەبەرکردوو دوات کەوتم بۆماڵەکەت لە شەقامی باکەر. وویستم لەدەرەوە ئەوە بدۆزمەوە کە ئایا تۆ بەڕاستی شارلك هۆڵمز بوویت. لەدەرەوەی دەرگاکەت پێم وتیت "شەوت شاد"! من و هاوسەرەکەم بیرمان لەوە کردەوە کە ئینگلتەرا بەجێبهێڵین، تکایە ئەوە بەپادشا ڕابگەیەنە کە دڵنیا بێت لەوەی وێنەکان پیشانی هیچ کەسێك نادەم من هاوسەرەکەمم خۆش دەوێت و ئەویش منی خۆش دەوێت. ئەو زۆر پیاوێکی باشترە لەپادشا، بەلاّم چەند وێنەیەکی جیاواز هەیە. پادشاش دەتوانێت کۆیان بکاتەوە، ئەگەرحەزبکات.

ئارین نۆرتەن

پادشاهاواری کرد: ئەو ژنە چییە؟ من بۆچی نەمخواست؟ ئەوە چۆن ژنێکە؟! شارلك هۆڵمز بە دەنگێکی بەرز ووتی: ژنێکی زۆر زۆر زیرەکە. ببورە گەورەم. ئەم کارە بەدڵنیایی تەواونەبووە. پادشاووتی: نەخێر نەخێر، ئەووای نوسیوە کەدڵنیابم لەوەی هەرگیز وێنەکان نیشانی کەس نادات. من لەو ووشەیە زیاترم ناوێت، ئێستا هیچ مەترسی‌یەکی لەسەرم نی یە، ئازیزم مستەر هۆڵمز چۆن بتوانم سوپاست بکەم؟! گەورەم من تەنها هیواخوازی شتێکم. پادشا ووتی: جارێ پێم بڵێی بزانم چییە.

- ئەو وێنانە.

پادشا بەسەرسامی‌یەوە سەیرێکی کرد، هاواریکرد: وێنەکانی ئارین؟ بەڵام دڵنیابە کەهی تۆن. لەگەڵ ئەوەشدا عەیب وعارێکی گەورە نەبوو بۆ خێزانی پادشایی ئەوروپا. شارلك هۆڵمز هەر وێنەی ئەو ژنەی لەلای خۆی هەڵگرتبوو کە لە خۆی زیرەکتربوو.

## ٣

# پێنج شوشە پرتەقاڵەکە
# چیرۆکی مامە ئیلیاس

لە سێپتەمبەری ساڵی ١٨٨٧ ژنەکەم سەردانی چەندخێزانێکی کرد، لەگەڵ شارلك هۆڵمزی هاوڕێی دێرینمدا لەشەقامی باکەر مابوینەوە، ئێوارەیەکی شێدارو زریاناوی بوو. لەدەرەوەدش بارانێکی بەخوڕدەباری، لەپڕدا یەکێك لەدەرگای دا. بەسەرسامی یەکەوەسەیری هاوڕێکەمم کردو ووتم: ئەبێت ئەمە کێ بێت؟ ئەبێت بەم بارانە بۆکارێك هاتبێت؟ شارلك هۆڵمز بە منی ووت ئەمە گرنگە. پاشان ووتی وەرە ژوورەوە. پیاوێکی گەنج هاتەژوورەوە، تەر بوو بوماندوو خەمباربوو، ووتی: من هاتووم داوای یارمەتی بکەم. گوێم لێبوو ئەیووت نازانم چی بکەم.هۆڵمز ووتی: دانیشەو چیت هەیە پێم بڵێ...

پیاوە گەنجەکە دانیشتوو قاچەتەڕەکانی لەئاگرەکە نزیک کردەوە، دەستی پێکرد، ناوم جۆهان ئۆپینشاوە، جۆسیپی باوکم برایەکی هەیە، بەشێوەیەکی تر مامە ئیلیاس، لەکاتی گەنجیدا چووەلەئەمریکا بژی، هەندێك پارەی لەوێ کۆکردبووەوە، ئەمریکاییەیە ڕەش پێستەکانی خۆش نەویستووە، بۆیە لەشەڕی ناوخۆدا دژی پیاوەکانی باکور دەجەنگا، هەروەها لەگەڵ هەندێکی باشوریشدا هەردەجەنگا، بەلام کاتێك باشوریەکان شەڕەکەیان دۆڕاند، کاتێك یەکسان بونەوە لەگەڵ ڕەش پێستەکاندا، مامە ئیلیاس ئەمەریکای بەجێهێشت و لە ساڵی (١٨٦٩) گەڕایەوە بۆ ئینگلتەراو لە خانویەکی گەورەدا ئە ژیا، پیاوێکی سەیرو دڵناخۆش بوو، هیچ کەسی بە هاوڕێ نەدەویست، جۆهان ئۆپینشاو بەردەوام بوو لەقسەکانی، هەمیشە ڕەشبین بوو، بەلام منی خۆش ئەویست، کاتێك تەمەنم دوانزە ساڵ بوو، چووم بۆ ماڵەکەی مامە ئیلیاس، زۆر بە سۆز بوو لەگەڵمدا، ئەمتوانی بچم بۆ هەموو شوێنێکی ماڵەکەی، بەلا ژوورێکی بچوك هەبوو لەسەربانی خانووەکە بەهەمیشەیی داخرابوو، کەس نەیئەتوانی بچێتە ناو ئەو ژوورەوە.

ڕۆژێکیان مامە ئیلیاس نامەیەکی بۆهات لە پۆندێنچیری هندەوە. ئەیوت: من کەس ناناسم لە پۆندێنچیری، بەلام کاتێك زەرفی نامەکەی کردەوە، پێنج ناوکە پرتەقاڵی بچوك لەنامەکە کەوتنە خوارەوە بۆسەرقاپەکەی بەردەمی، خەریك بوو دەست بکەم بەپێکەنین، بەلام کاتێك دەموچاوە زەردهەڵگەڕاوەکەی مامم بینی پێنەکەنیم، مامم هاواریکرد: KKK ئاخ خوایەگیان، ئەوان دۆزیمیانەوە،!

ووتم: مەبەستت کێیە؟ مامە.

قیژاندی و بەسەر قادرمەکاندا ڕایکردو ووتی: مردوو.

سەیرێکی زەرق نامەکەم کرد، لەدواوە سێ نیشانەی (Ks) لەسەربوون. کەنوسین نەبوو، کێ ئەمەی ناردووە؟ باشە بۆچی مامم بەو جۆرە ئەترسێت؟ مامە ئیلیاس ڕاستەوخۆ بەرەو ژورە نهێنی‌یەکە ڕۆشت. و سندوقێکی دەرهێنا کە نیشانەی (Ks) لەسەربوو. هەموو وەرەقەکانی ناوسندوقەکەی سوتاندو بە منی ووت: جۆن من ئەزانم کە بەم نزیکانە دەمرم، براکەم کە باوکی تۆیە دوای مردنم هەموو پارەو خانووەکەم بۆئەو دەبێت، لەپاشانیشدا دوای مردنی ئەو هەموویان بۆ تۆ دەبێت. هیوادارم تۆ بتوانیت پێی بگەیت و بەخۆشی بگوزەرێنیت تیایدا، بەلاّم ئەگەر وا نەبیت، ئەوا دەچێتە ژێر دەستی خراپترین دوژمنت، من لەوە دەترسم کە هەر لەگەڵ مردنمدا پارەکانم بچێتە ژێر دەستی ئەوانەوە. لەمەبەستی ئەو تێنەگەیشتم، لەو چەند هەفتەیەشدا هیچ ڕووی نەدا، هەستم بە هیچ شتێکی خراپ نەئەکرد، بەلاّم مامم زۆر ئەترسا، بەدرێژایی کات لەژوورەکەیدا دەمایەوە، زۆر لە جارانی پێشوو زیاتری ئەخواردەوە، زۆر بەدیقەتەوە هەموو دەرگاکانی دائەخست، پاشان شەوێکیان زۆر سەرشێتانە خواردی‌یەوەو وەحشیانە لەماڵ هاتەدەرەوە، بۆ بەیانی بە مردوویی لەڕوبارێکدا دۆزیمانەوە، پۆلیس ووتیان: خۆی کوشتووە! بەلاّم من ئەمزانی لەوە ئەترسا بمرێت، بەلاّم نەمزانی ئایانەوە ڕاستە!، هۆلمز چەند چرکەیەك قسەکانی بەپیاوە گەنجەکە بڕی و، ووتی پێم بڵێ کەی مامت ئەو نامانەی لەهندەوە بۆهات؟ وەکەی مرد؟ جۆهان ئۆپینشاو وەلاّمی

دایەوە: نامەکان لە (١٠) ی مارچ ی ١٨٨٣ داگەیشتن. حەوت ما دوای ئەوەش مرد، هۆلمز ووتی: سوپاس بەردەوامبە.

دوای ئەوەی مامم مرد، باوکم چووە خانووەکەوە، بەسیقەوە پێم ووت، کەزۆر بەووردی و دیقەتەوە لەو ژوورە داخراوە بڕوانێت، بەلاّم هیچ شتێکی گرنگمان نەدۆزی یەوە.

٢

# تۆوێکی زۆر

جۆن ئۆپنشاوو، ووتی: هەتا ساڵێک دوای ئەوە هەمووشتێک بەباشی دەڕۆشت، بەلاّم بەیانی یەکیان باوکم نامەیەکی کردەوە پێنج ناوکی پرتەقاڵی لێکەوتە خوارەوە، باوکم پرسی ئەمە واتای چی‌یە جۆن؟ لەگەڵ ئەوەشدا دەموچاوی زەردهەڵگەڕابوو، ووتم: سەیرکە نیشانەی (KKK) لەسەرزەرفەکەیە، ئەم پیتانە لەسەرنامەکەی مامە ئیلیاسیش بوون، ئێمە هەردووکمان ئەترساین. لەوکاتەدا ووتی: بەڵێ، ناوکەکان لەباخەکەدا دابنێ. کام ناوکانە؟ ئەو ناوکانەی لەناو سندوقەکەی مامە ئیلیاسدا بوون. ووتم: بەلاّم ئەو هەموویانی سوتاند. باوکم ووتی باشە ئەم نامانە لەلایەن کێوە هاتوون؟ سەیرێکی زەرفی نامەکەی کرد، دۆندی سکۆتلاند! بەڵێ، من هیچ دەربارەی ئەم ناوك و وەرەقانە نازانم. من هیچ شتێکم نەکردووە. ووتم: باوکە تۆ ئەتوانیت بە پۆلیس بڵێیت. نامەکانم بیرکەوتەوە کە لەهندەوە بۆمامم هاتبوون، زۆر بێتاقەتبووم، باوکم هەر ئەیووتەوە، ئەوانە پێم پێئەکەنن باهەرلەبیری خۆمانیان ببەینەوە. سێ ڕۆژ دوای ئەوە باوکە

هەژارەکەم چوو سەردانی هاوڕێیەکی دێرینی بکات کە چەند میلێك دوور بوو لێمانەوە. بەڵام بۆ هەمیشە نەگەڕایەوە، پۆلیسیش ووتیان ئەو بەتاریکی گەڕاوەتەوە بۆماڵەوە بۆیە لەگردەکە کەوتۆتە خوارەوە، زۆر بەخراپی برینداربووبوو پاش ماوەیەکی کەم مرد، ئەوان وایان ئەزانی ئەمە ڕووداوێك بووە، بەڵام من بەوە ڕازی نەبووم و باوەڕم نەکرد، وامدەزانی کە بە ئەنقەست کوژراوە، نەمئەتوانی ئەو پێنج ناوکی پرتەقاڵە و ئەو نامە سەیرانە لەبیربکەم کە بۆ مامە ئەلیاس و باوکم ئەهاتن، بەڵام هەوڵم ئەدابیرم بچێتەوە، وانزیکەی سێ ساڵەخۆم بەتەنیا لەو خانووەدائەژیم، دوێنێش ئەمەم بۆهات: پیاوەگەنجەکە زەرفێ نامەیەکی نیشان داین کە نیشانەی KKK ی لەسەربوو، لەگەڵ پێنج ناوکەپرتەقاڵی بچوك، ووتی: سەیرکەن، ئەمە لەخۆرهەلاتی لەندەنەوە هاتووە، کەتیایدا نوسرابوو: وەرەقەکان لەباخەکەدا دابنێ: ئەمە هەر ئەو ووشانەن کە لەنامەیەکدا بۆباوکم هاتبوون، هۆڵمز ووتی: ئەی لەمەولا ئەتەوێ چی بکەیت؟

ئۆپەرشاوو ووتی: هیچ ... هەردوو دەستی گرت بەسەریەوە. نازانم چی بکەم من ئەترسم! هۆڵمز هاواریکرد: هیچ ؟! کوڕی باش تۆ دەبێت بە خێرایی هەندێك شت بکەیت. تۆ لەمەترسیدایت!!

ئۆپشاوا بەخەمباری یەوە ووتی: بەدڵنیایی من ئەمەم دەبرد بۆ پۆلیس. بەڵام پێم پێئەکەنن، ئەوان وای بۆ ئەچن کە هیچ شتێکی وانییە گرنگی پێبدرێت و هۆکاری خەمباری و ناڕەحەتی بێت. هۆڵمز هاواری کرد: چۆن ئەوان لەسەرئەمە بێدەنگ بوون؟! باشە تۆ بۆچی ڕاستەوخۆ نەهاتی بۆلای من؟ دوژمنەکانی تۆ لەدوو ڕۆژ زیاتریان

پێویست نی یە بۆ دانانی پلانێك. تۆ هیچت نەدۆزیوەتەوە کەبتوانی یارمەتی ئێمەی پێبدەیت؟ چۆن تۆپشاوو وتی: بەڵێ ئەمەم لەژووره داخراوەکەدا دوزییەوە. پاشماوەی چەند پاچە وەرەقەیەکی سوتاوی نیشان دایین. ئەمانە لەگەڵ وەرەقەکانی مامم دابوون، کەلە دەستوخەتی خۆی ئەچن تیایداهاتبوو:

لە (٧)ی ماچ ی (١٨٦٩) ئەم تۆوانە بۆسیٚ کەس نێردراون.

براون. ڕۆبنسەن لەگەڵ وولیام

لە (٩)ی ماچ براون کۆچی کرد.

لە (١٠)ی ماچ وولیام کۆچی کرد.

لە (١٢)ی ماچ ڕۆبنسەن سەردانێکی کردو کۆتایی بە ئیشەکەی هێنا لەگەڵیاندا.

شارلك هۆلمز ووتی: سوباس. ئێستا تۆ پێویستە بەخێرایی بگەڕێیتەوە بۆماڵەوە. ئەم وەرەقانە بخەرەوە ناو سندوقەکەی مامتەوە. لەنامەیەکدا تیایدا بنووسە کەمامت هەموو وەرەقەکانی تری سوتاندووە. پاشان سندوقەکە لەدەرەوەی باخەکەدا دابنێ، هیوادارم دوژمنەکانت بەمە دڵخۆش بن. دڵنیابە لەوەی کەتۆ زۆر لەمەترسیدا دەبیت تۆ چۆن دەگەڕێیتەوە بۆماڵەوە؟!

ئۆپشاوا ئەیوتەوە: لە مەورقیفی واتیرلۆوە بە شەمەندنەفەر، هەروەها خەڵکێکی زۆر لەسەرشەقامەکە دەبن. من دەزانم تۆزۆر باش دەبیت بەلاّم ووریابەو ئاگات لەخۆت بێت.!

نۆپشاوا ووتی: سوپاست دەکەم مستەر هۆلمز. من هەموونەو شتانە دەکەم کە تۆ پێت ووتوم. لەشەوێکی تاریکی باراناوی وشێداردا چووە دەرەوە.

KKK

شارلك هۆلمز بە بێدەنگی دانیشتو سەیری ئاگرەکەی دەکرد. پاشان پێی ووتم: جۆن ئۆپنشاوو بەڕاستی لەمەترسیدایە، بۆچی مامە ئیلیاسی ئەمەریکای بەجێهێشتووە؟! چونکە دوژمنی هەبووە. کاتێك هەستی بەترس کردووە گەڕاوەتەوە بۆ ئینگلتەرا، باشە بۆچی بەتەنیا ژیاوەو زۆرچاو کراوە بووەو بەحەزدەرەوە هەموو دەرگاکانی لەسەر خۆی داخستووە پاشان ئەو نامانەی لەکوێوە بۆ دەهات؟! تۆ دەزانیت؟ وەلامیم دایەوە: یەکەمیان لە پۆنۆچری لەهندەوە بۆهاتبوو، دووەمیش لەدۆندی سکوتلەنداوە، سێیەمیشیان لەخۆرهەلاتی لەندەنەوە.

هۆلمزپرسی: ئەمانە ئامارژەبەهیچ دەکەن بەڕای تۆ؟ ئەوان هەموویان پۆلیسی دەریایی بوون، ئەوکەسەی کەنامەکانی نوسیوە لەسەرکەشتی بووە کاتێك نوسیویانیەتی، من ئەموتەوە، و لەگەڵ وەلامەکەمدا تکام لێدەکرد، هۆلمزووتی: زۆرباشە واتسۆن، کەسانێك هەندێك تۆویان لەهندەوە ناردووە، پاشان حەوت حەفتەدوای ئەوە هاتوون بۆکوشتنی مامە ئیلیاس، پاشان هەندێك تۆوی لە سکوتلەنداوە ناردووە، پاشان سێ ڕۆژدوای ئەوە هاتووە بۆکوشتنی باوکی جۆن. ئێستا نەزانیت بۆمن قەلەق و دوودڵم؟ ئێستاش چەند

تۆوێکی لە لەندەوەنەوە بۆ جۆن ناردووە! دووژمنەکانی جۆن ئێستا بە هەموو ئامادەباشی‌یەکەوە لەلەندەندان! هاوارم کرد: باشە باشە هۆلمز! ئەو پیاوە کێیە؟ من بزانم لەیەك پیاو زیاترن، ئەوان درێژە پێدەری (Ku Klux Klan)نن. کە کورتکراوەکەی KKK یە. ئایا تۆ هەموو شتێکت دەربارەیان نەبیستووە؟ ئەوان گروپێکی زۆر نهێنی و شاراوەن لە باشووری ئەمریکا. ئەوان بۆ وەستاندنی یەکسانی لە نێوان ڕەش پێستەکاندا و وەهەموو ئەوانە بکوژن کەپێیان ڕازینین. پۆلیس نەیتوانی دەستگیریان بکات. بەلاّم لەساڵی (١٨٦٩) مامە ئیلیاس. یەکێك بووە لەدرێژە پێدەرانی ئەو گروپە نهێنی‌یە. لەپڕێکدا ئەمریکای بەجێهێشتووەو هەموو وەرەقەکانیشی لەگەڵ خۆیە هێناوە، لەدوای ئەوەوە گروپەکە نەیانتوانیوە بەردەوام بن لەسەرکارەکانیان. کەبەدڵنیایی‌یەوە گروپەکە ویستویانە ئەو وەرەقانە بگێڕنەوە بۆخۆیان. تۆپارچە وەرەقە سوتاوەکانت بیرە؟ ئەوە یادگاری ڕۆژانەی مامە ئیلیاس بووە، ئەو لەگەڵ KKK کاریکردووە. تۆوەکانی ناردووە بۆ ترساندنی ئەو سێ پیاوە. بۆئەوەی وولاّتەکە بە جێبهێڵن. بەلاّم کەسێکە کە KKK نەیانتوانیوە کارەکەیانی لەگەڵداتەواو بکەن. یان بیکوژن. KKK هەمیشە کاریان بۆ شتێکی لەم جۆرە کردووە. ووتم: بەدڵنیایی یەوە ئەیانەوێ ئۆپنشاووی لاویش بکوژن.

# کۆتا مردن

تەنها ئەوان کردبویان. بەیانی داهاتوو لەڕۆژنامەدا خوێندمانەوە کە چۆن ئۆپنشاوو مردووە. پیاوەکانی پۆلیس لەڕوبارێکدا نزیك مەوقیفی واترلۆ دۆزیویانەتەوە. پۆلیس ووتیان ئەوە ڕوداو بووە. بەڵام ئەم ڕوداوە هۆڵمزی زۆر تووڕەکردبوو. هات بۆلای من یارمەتی بدەم، بەڵام چەند پیاوێك بە ئانقەست کوشتیان.! ئەچم بۆ دۆزینەوەیان، ئەگە ە کۆتا ئیشیشم بێت کەئەیکەم.! ئەمانەی پێ ووتم وبەخێ ... ـماڵ چووە دەرەوە. ئێوارەکاتێك گەڕایەوە بۆماڵەوە ـەشەقامی بەیکەر، زۆر ماندووبوو بەڵام تکای کردو ووتی: واتسۆن! من ناوی دوژمنەکانی ئۆپنشاوو دەزانم! ئێستاش دەڕۆم بۆئەوەی موفاجەئەیەکیان بۆبنێرم.! ئەمەزۆر ئەیانترسێنێت! پێنج تۆو یان ئاوکە پرتەقاڵی بردو خستیانیە ناوزەرفێکی نامەوە. لەسەرزەرفەکە ووسـ ( S.H. for J.C ) ئەمجارەیان من تۆوەکانم نارد، ئەوەکو h... لەشارلك هۆڵممزەوە بۆ کابتن جایمس کالۆن کەشتیکەی ئەو ـاوی ستاردبوو، ئێستا جایمس کالۆن و پیاوەکانی بەگەشتێکی دریایی دا ئەگەڕێنەوە بۆ جورجیا لەوویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

پرسیم: هۆلمز تۆچۆن ئەوت دۆزیەوە؟ وتی: کاغەزی کەشتی، سەیری سەددها لەوانەم کرد ئەمڕۆ. تەنهایەك کەشتی، ئەویش ستار. بوو لەکاتێکی گونجاودا لەکەناری دەریاکەدابوو، ئەم بەیانیەش ستار لەندەن بەجێدەهێڵێت و بەگەشتێك دەگەڕێتەوە بۆ جۆرجیا. منیش

لەدەرەوە ئەو کابتنەودووپیاویم دۆزی‌یەوە، هەموویان ئەمریکایی بوون، شەوی ڕابردوو لەسەرکەشتی یەکە نەبوون، من دڵنیابووم کەئەوان جۆن ئۆپنشاووی هەژاریان کوشتبوو! کاتێك ئەوان ئەگەنە ئەمریکا، بەدڵنیایی تۆوەکان دەهێنن و پاشانیش پۆلیس دەستگیریان دەکات،...! شارلك هۆلمز لێکۆڵەرێکی زۆر زیرەك بوو؛ بەلام ئەو نەیتوانی هیچ شتێك بکات لەگەڵ کەش و هەوادا، ئەو ساڵە زریانەکانی زستانی ناو دەریا هەمووئەم شتانەی خراپ کرد، بۆیە ستار بەهیچ جۆرێك نەگەیشتە جۆرجیا، کەسیش جارێکی تر کابتن و پیاوەکانی نەبینی یەوە، بکوژەکانی جۆن ئۆپینشاوو، تۆوەکانیان نەهێنا، بەلام...لەکۆتایی دا، مردن گەیشت بە هەمویان و لەدەریاکە خنکان.

*　　*　　*

١- بۆهیمیا ناوچەیەکە کۆمەڵێکی تیادا نیشتە جێیە لەنوسەران وهونەرمەندان، ژیانێکی بۆ هیمی دەژین کەپێی دەوترێت ( دنیای بۆهیمیەکان ).

کۆتایی....

